

ناوی پەرتووک: ڕێنمایەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی گوگڵ پلاس

وەرگێڕ و زیادکراوە : قەزوان

پیداچوونەوە و راستکردنەوەی زمانەوانی : سەڵاح ئەحمەد

**پێشکەش بێت :**

سەرەتا ئەم پەرتووکە پێشکەشە بە دایک و باوکم، هیوای تەمەن درێژی و کامەرانی و سەرفرازیان بۆ دەخوازم ، هەروەها پێشکەشە بە گیانی پاکی شەهیدانی هەڵبجەی خۆشەویست و براو هاوڕێ خۆشەویستەکانم لە کوردئایتیگرووپ[1] بە تایبەت کاک زەندی ئازیز کە لە ڕێگای گوگڵ پلاس بوم بە هاوڕێی و لەگەڵ کوردئایتیگرووپ ئاشنای کردم.

دەستخۆشی تایبەتم بۆ برای بەڕێز ماموستا سەلاح ئەحمەد بەڕێوەبەری ماڵپەری کوردکیمی[2] کە سەرباری سەرقاڵی بوونی بە خوێندن و لێکۆڵینەوەی ماستەرنامەکەی ئەرکی پێداچوونەوەی بۆ ئەم پەرتووکە خستەئەستۆی خۆی.




[1]- کورد ئایتیگرووپ تاقمەیێکی خۆبەخش، کە لە بواری ئایتی کوردی ئیش دەکەن ، **www.kurditgroup.org**

[2]- ماڵپەڕی کوردکیمی کەتایبەتە بەزانستی کیمیا **www.kchemy.org/meko/index.php**

پێرست :

## پێشەکی:

خۆشەویستان لەم پەرتووکەی لەبەر دەستاندایە هەوڵ ئەدەین ڕێنمایەکی کورت و شیاوتان سەبارەت بە تۆڕی کۆمەڵایەتی گوگڵ پلاس و شێوازی کار پێکردن لەگەڵ ئەم خزمەتگوزارییەی گوگڵ بخەینە بەرچاو .خوێنەری بەرێز ، هەرلەکاتی خوێندنەوەی ئەم پەرتووکەی لەبەردەستان دایە دوورنیە کە لەهەمان کاتدا ئەندامی یەکێک یان چەند تۆڕێکی کۆمەڵایەتی وەک فەیس بووک ، تویتەر ، سپەیس ....هتد. ئەم پرسیارە بە بیرتان دا بێت ، کە ئایا بۆچی دەبێت من خۆم تۆمار بکەم لە گۆگڵ پلاس؟ لەکاتێک دا لەو تۆرە کۆمەڵایەتیانەی تردا کەئاماژەمانپێکردوەخۆمان تۆمارکردووە؟




وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر سادەیە، کە بەراورد کردن لەنێوان گۆگڵ پلاس و تۆرەکۆمەڵایەتیەکانی تری بۆنمونە وەک فەیس بووک و تویتەر دەگەڕێتەوە بۆ خێرایی پەرەسەندن و ئەو خزمەتگوزاریانەی گۆگڵ پلاس کە دەتوانرێت لەسەرجەم خزمەتگوزاریەکانی گۆگڵ سوود وەربگیرێت، هەروەک هەموان شارەزاین لە دنیای ئینتەرنێت بەبێ بوونی گۆگڵ و ئەو خزمەتگوزاریە بێشومارەی هیچ مانایەک نامێنێتەوە بۆ دنیای ئینتەرنێت.

هەندێک جار لێرەو لەوێ هەواڵی نادروست و دوور لەراستی یەوە، لەوانەیە بەرگوێمان کەوتبێت ، کەگوایە پرۆژەی گۆگڵ پلاس سەرنەکەوتووە و شکستی هێناوە، بەڵام هەروەک بەرێوەبەری گۆگڵ لەچاوپێکەوتنێکی (گۆڤاری تایمز) دا ، ئاماژەی بەخێرایی پەرەسەندنی گۆگڵ پلاس دا کە بەرای ئەوان تاکو ئێستا هیچ شتێکیان بەخێرایی گۆگڵ پلاس بەرچاو نەکەوتووە، بۆیە سەرلەبەری ئەم هەواڵانەی بە هەواڵی ناراست و دروست لەقەڵەم دا.

تێبینی : خۆتۆمارکردن لە گوگڵ پلاس بەواتەیێکی تر سوود وەرگرتن لە تەواوی خزمەتگوزاریەکانی گوگڵە کە لە داهاتوێکی نزیکدا کەڵکی لێوەردەگرین. بۆ نمونە : گەڕان بەدوای کەسایەتیەکان، بارکردنی وێنەکان و هاوبەشیکردن لەپەرگەکان ، ئەمە سەرباری بەدەستهێنانی زانیاریەکان بەشێوازێکی زۆر خێرا.

## ٢-گۆگڵ پلاس (google plus)یاخود (+g) جی یە؟

### ٢-١ : ئایا گوگڵ پلاس تۆڕێکی کۆمەڵایەتی ترە؟

گوگڵ+ ، تویتێر،فەیسبووک...هتد تۆڕی کۆمەڵایەتین ئەم تۆڕانە بە شێوەیێک دارێژراون کە ئێوە بتوانن بە خێرایی هاوبەشی بکەن لەنێوان ئێوەو هاورێ و کەسانی تردا لەئاڵوگۆری بۆچوونەکانتان،وێنە وبەستەرەکانتان...هتد

### ٢-٢:گۆگڵ پلاس و جیاوازی لەگەڵ هاوشێوەکانی دا




ا).جیاوازی فەرمی ئەم تۆڕە ئەوەیە کە لەگەڵ خزمەتگوزاریەکانی تر وەک جی مەیل، پیکاسا، گوگڵ درایف،یوتیوب،...هتد تێکلاو بوە بەلام تویتێر و فەیسبووک تەنها پلاتفۆرمێکن کە ڕێگە بە هاوبەشیکردنی زانیاریەکانمان دەدەن.




ب). خاڵێکی تر کە گوگڵ پلاس لە تۆڕەکانی تر جیا ئەکاتەوە ئەوەیە کە پێناسەیەکی نوێ لە تواناکانی خۆی بەناوی بازنەکان Circles کە ئەم توانایە ڕێگەئەدات کە چ کەسێک توانایی بینینی زانیاریەکانی ئێوەیان هەیە و بۆ هەر ئەندامێک بازنەی تایبەت دروستبکەیت.

### ٢-٣:باشە ئەم سیستەمە چۆن کار ئەکات ؟

تویتەکان بەگشتی و پەڕەکانی فەیسبووکیش لە ڕابردوو تا ڕادەیێک دەتوانرا هەموو زانیاریەکان ببینین. هەر چەند لە ئێستا تایبەتمەنی باشیان دابینکردوە بەلام گوگڵ پلاس تەنها ڕێگە بەو کەسایەتیانەئەدات کە ڕەزامەندن لە بینینی زانیاریەکانتان و دەستکەوتنی زانیاری لەسەر کەسایەتیتان (پرۆفایلەکانتان). لێرەدا چەند نمونەیەکتان بۆ دەخەینە ڕوو بۆ بەرچاوڕوونیتان:

لە کومپانیایەک ئیش دەکەم و دەمەوێت ئەم ڕەستەیە بنوسم (تویت بکەم) : "بەنەفرەت بێت ئێشەکەی من" بەلام پێم خۆش نیە بەرێوەبەرەکەم ئەم دەقە بخوێنێتەوە یان نمونەیەکی تر لە فەیسبووک ، بۆنمونە ڕێگەگرتنی دایک و باوکتان لە بینینی وێنەکانی میوانی و شەو ئاهەنگێک کە لەگەڵ هاورێکانتان بەسەرتان بردووە، تاکو بەبینینی ئەو شەوئاهەنگە دڵگران نەبن ! هەر چەند هەر وەک باسمانکرد فەیسبووک پێشکەوتن و چاکسازی لەم بوارەدا کردوە ، بەلام لە گوگڵ پلاس زانیاریەکانتان بە تەواوی لە ژێر چاودێری ئێوە دایە کاتێک هەرشتێک هاوبەش ئەکەن دەتوانن ئاستی بینینی بۆ دابین بکەن کە کێ دەتوانێت ئەم بابەتە ببینێت: هاورێکانم مامۆستاکانم یان دایک و باوکم . لەداهاتوودا بەدرێژی گفتوگۆ دەکەین سەبارەت بەچۆنیەتی ئەم کارە.لێرەدا دێینەسەر جۆنیەتی خۆ تۆمارکردن و کردنەوەی هەژمار لە گۆگڵ پلاس .

## ٣. دروستکردنی هەژمارەی گوگڵ پلاس:

کرتـە بکـە لـە سـەر بەسـتەری **+You** کە دەکەوێتە لای چەپی پەڕەی سـەرەکی گوگـڵ. کەلەپاشـاندا پەرگەیـەکی نـوێ هاوشێوەی ئەم وێنەیەی لای خوارەوە تان بۆ دەکرێتەوە، لەپاشان دا کرتەبکەنە لە سەر ڕەستەی create an account




لەم پەڕەنوێ یەدا بەسێ قۆناغ دروستکردنی هەژمارەکەتان بۆ روون دەکەینەوە:

1 قۆناغی یەکەم ناو و زانیاریـەکانت پـڕ دەکەیتـەوە ، بەتایبـەت ژمارەی موبایـل و ئیمەیلەکـەت( current email address ) بە دروستی تۆماربکە بۆ ئەوەی کاتێک وشەی نهێنیت لە بیر دەچێت کۆدی چالاک بوونت بۆ ئەو ئیمەیلە یان بۆ موبایلەکەت دەنێرێت، لەکۆتایی دا پەسەندکردنی یاساکانی گۆگڵ.

2 قۆناغی دووەهەم بارکردنی وێنەی کەسایەتی خودی خۆتان بۆ ناو پرۆفایلەکەتان، باشتر وایە وێنەکەتان وێنـەی کەسایەتی خۆتان بێت ، کەئەمە هاریکاری و ئاسانکاریەکی باش دەبێت بۆ دۆزینەوەتان لەلایەن هاوڕێکانتانـەوە، هـەروەها ئەگەر لە تۆڕێک یان زیاتری کۆمەلایەتی کەدا بەشداریتان هەیە و دەتوانن هەمان وێنەی کە لـەو تـۆڕەدا داتان نـاوە لـە گۆگڵ پلاسیش هەمان وێنەدابنێن.

2

How you'll appear

Google

qezwan

Your public profile will help your friends recognize you.

ADD PROFILE PHOTO Next step

2

How you'll appear

Google

qezwan

Your public profile will help your friends recognize you.

EDIT PROFILE PHOTO Next step

تێبینی : شێوازەکانی بارکردنی وێنە بۆ سەر پرۆفایلەکەتان:بارکردنی وێنەکانمان بە دوو ڕێگایە ، ڕێگەی یەکەم لە ناو کۆمپیوتەرەکەمان دا وێنەیەک دەستنیشان دەکەین. ڕێگەی دووەم لە وێبکۆمدا کاتێک وێنە بار بوو دەتوانن قەبارەکەی ڕێکبخەین و لە ئەنجام دا وێنەکەمان لە پرۆفایلەکەمان دا دادەمەزرێت کرتە لە سەر دوگمەی Next بکە بۆ قۆناغی سێهەم.

3 قۆناغی سێهەم گوگڵ پێشنیارێک ئەخاتە ڕوو بۆ دۆزینەوەو گەڕان بەدوای هاوڕێکانت یان ئەگەر هەژماری hotmail یان yahoo تان هەیە دەتوانیت بەکرتەیەک لە سەر هاوڕێکانت لە ناو ئەو هەژمارانە ئاگاداری هەژماری گوگڵ پلاسەکەت بکەیت، یان لە بەشی خشتەی گەڕان (+search for people on google)ناو، ئیمەیل یان قوتابخانەی هاوڕێکانت بنوسیت و بۆیان بگەڕێت ئەگەرنارازیت ئەوا دوگمەی بەردەوام Continue » بوون هەڵبژێرە.

Google+ qezwan2012@gmail.com

1 Add people

2 Be awesome

Add people you know

You'll see what your friends & family are sharing when you add them. Learn more

Search for people on Google+

Enter a name, school, email address...

Find friends from another account

Yahoo! Hotmail

Continue »

دوای هەڵبژاردنی دوگمەی بەردەوام بوون گوگڵ ئەو پرۆفایلانە کە زۆرترین هاوڕێیان هەیە یان زۆرترین سەردانی کراوە لە بەشێکی جیاواز پیشان ئەدات .




لە قۆناغی کۆتایی پرکردنەوەی زانیاری پرۆفایلەکەت پێویستە بە تەواوی پربکەیتەوە هەروەک شوێنی کارخوێندن‌ژیانت ....هتد، پاشان کرتەیێک لە سەر دۆگمەی Finish بکە تا بچیتە نێو پەڕەی سەرەتایی گوگڵ پلاسەکەت .



ئێستا ناوەکەمان لە مینۆباری گۆگڵ پلاس دا دەردەکەوێت.




کرتەیێک لە سەر ناوی بەکارهێنانەر بکەن تا برۆنە پەڕگەی سەرەکی تۆڕەکەتان .کرتەیێک لە سەر ئایکۆنی (پرۆفایـل) بکـــــــەن Profile زانیاری سەرەتایی خۆت دەبینیت جا ئێستا کرتەیـەک لـە سـەر دووگمـەی دەسـتکاریکردن تـاکوو Edit profile پرۆفایلەکەت دەستکاری بکەی وزانیاری نـوێ تێـدا بنوسـیت هـەر چـی زانیاریـەکانت ڕاسـت تـر بێـت، ئاسانترو خێراتر هاورێکانت دەتوانن بتان دۆزنــەوە، ئەگـەر بتانـەوێت نـاوی خۆتـان بگـۆڕن نـاوی ئێـوە لـە تـەواوی خزمەتگۆزاریەکانی گوگڵ و هەر وەها سیستەمەکانی دەگۆردرێت.

---

## ٤-پرۆفایلی هەرئەندامێک لەم زانیاریانەی لای خوارەوە پێکهاتووە :

Tagline : کورتەیەک سەبارەت بە کەسایەتی خاوەن پرۆفایلەکە،
ئەم شرۆفەیە لەژێر ناوی خاوەن پرۆفایلەکە دەردەکەوێت.

Introducition : لەم خشتە گشتیەدا پێویستە زانیاریە گرنگەکانمان بنوسین ، کەپێویستە هاورێکانمان بەزووترین کات لەرێگەیەوە بمان دۆزنەوە.

Braggnigrights: زۆر گرنگ نیە ئەتوان وازی لێ بێنن.

Occupation :کارو پیشەتان چی یە ؟!

Employment : لەکوێ دامەزراون.

Education : ناوی قوتابخانەکان کە خوێندنتان تێیدا کردوە.

Place lived : جێگەی ژیان و گوزەرانتان.

Home : ئەگەر پێتان خۆشە ئەتوانن ژمارەی موبایل ومالّەوەتان لێرە بنوسن.

Work : وەک خشتی home زانیاری کاریتان لێرە ئەنوسن.

Relationship: ئاستی ئێوە بۆ هاتنە نێو ئەم تۆرە دابین ئەکات وەک فەیسبووک.

Looking for :بۆچی ئەگەرێن هاورێیایەتی ، پەیوەندی، هاورێیایەتی ئینتەرنێتی ؟

Gender : نێر یان مێ؟پیاو یان ژن ؟

Other names : ناوەکانی ترتان شایەد بلێن ناز ناو بێجگە لە نێوی فەرمیتان.

Profile Discovery :ئەم رستەیە نیشانە بکەن :
" Help others discover my profile in search results

Other profiles : هەژمارەی گوگل پلاس بە هەژمارەکانی ترتان وەک فەیسبووک وتویتێر ئەچەسپێنن.

Contributor to : مالّپەرە جیاوازەکان کە ئیشی تێدادەکەن لێرە بینوسن.

Recommended link: ئەو مالّپەرانە کە زۆرتر سەردانی ئەکەن وپێتان خۆشە خەلّکی تر یان ئەندامانی تر بزانن لێرەدا تۆماربکەن.

تێبینی : دەتوانن تەواوی زانیاریەکانتان لەم خشتانە ئارەزوومەندانـە ببینرێـت یـاخود نـەبینرێت. پرسـیار لێـرەدا ئەوەیـە کـە ئایـا چـۆن دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین ؟بۆ نمونە ئەگەر بمانەوێت وێنەکەمان لە پرۆفایلەکەمانـدا دەرنەکـەوێت تـەنها کرتەیـەک لـە سـەر دوگمـەی Edite profile بکەن. لەپاشان دا لە سەر خشتی photoes کرتەیێک ئەکەم و ئەم رستەیە " Show this tab on your profile " ناچالاک دەکەم، بۆ ئەو خشتانەی تریش هەمان شێواز بەکار دەهێنین.**لـە سـەر هـەر خشـتێک کرتـە بـکـەن پـەنجێرەیێکی چکۆلـەتان بـۆ دەکرێتەوە کە دەتوانن بە سادەیی دەستکاری زانیاری یان زانیاری نوێ تێدا بنوسن.**

## ٥- بازنەکان Circle

بازنەکان کۆمەڵێک یان پۆلێکن لە هاورێکان کە پێتان خۆشە ئەم کۆمەڵە هاورێ یە تەنانەت بابەتەکەتان ببینێت و ئەوانی تر نەیبینن. بۆ نمونە ئێوە چەند کۆمەڵەتان هەیە وەک خێزان، مامۆستاکانتان، هاورێکانتان بەڵام پێتان خۆشە تەنها بازنەی هاورێیان وێنەی شەوی رابردوتان ببینێت، بۆ ئەنجام دانی ئەو کارەش لە بەشی Stream دا تەنها دەتوانن ئاگاداربن لەو بازنەیەدا چی ئەگوزەرێت.بەم شێوەیە دەتوانین چەند بازنەمان بوێت دروستتیان بکەین و هەر بازنەیەکیش بەپێی ئارەزووی خۆمان ناوی بازنە و ئەندامانی ئەو بازنەیە دیاری بکەین و رێگەیان بدەین کە بەپێی خواستی خۆمان ئاگاداری پرۆفایل و ئەوەی دەگوزەرێت لەو بازنەیەدا.

تێبینی : هیچ یەکێک لە ئەندامان وهاورێیانتان نازانن کەئایا ئێوە هاورێکانتان لە کام بازنە جێگیرتان کردوون وە ئەمەش یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی بازنەکانی گوگڵ پڵاسە و سنوری تایبەتی ئێوە دەپارێزێت.بازنەکان رێگایێکی سادەو بەهێزە بۆ ناردنی زانیاریەکانمان هەروەها بۆ ئەو کەسانە کە پێمان خۆشە نوسراوەکانیان لە گوگڵ پڵاس دەربکەون و ئاگاداریتان لێی هەبێت کە کۆمەڵەکانی دیکە بێخەبەربن .

### ٥-١ : چۆنیەتی دروستکردنی بازنەیەک:

لە شریتی لا تەنیشتی چەپی گوگڵ پڵاس More کرتەیێک بکە تا پەنجێرەیێکی بچکۆلەمان بۆ دەکرێتەوە




پاشان کرتەیەک بکە لە سەر circles تاکو بچینە پەرگەی بەرێوەبردنی بازنەکا.:



گوگڵ پلاس کۆمەڵێک بازنەی خۆکارانەی ئامادە کردوە وەک هاورێیان،خێزان،ئاشـنایان (ئـەو کەسـانە کـە نـەتانبینیوە بـەڵام ئەیانناسـن)و شێوێنکەوتنەکان(ئەوکەسانە نەبینیوتانە نە ئەیانناسن بەڵام زانیاریەکانیان کە دایـدەنێن بۆتـان سـەرنج راکێشـە)ئێـوە ئـەتـوانن لـەم بازنـە ئامادانە سوود وەربگرن یان خۆتان بازنە دروستبکەن.بۆ ئەوەمەبەستە کە بازنەیێکی تایبەت دروستبکەن کرتەیێک لـە سـەر یەکـەمین بازنـە بکە کـە لەسـەری نوسـراوە " Drop here to create a circle " کەسـەرەنجام پەنجـەرەیێک هـەروەک ئـەم وێنەیـەیلای خـوارەوە دەکرێتەوە: لەپاشدا ناوێک لەو بازنەنوێ یە دەنێین، پاشـان کرتەیـەک بکـە لەسـەر Add a new person بگـەڕێن بـۆ هاورێیـانی تایبەت بەم بازنەیە:




دەتوانن لە خوارەوەی ناوی بازنە روونکردنەوەی پێویستی لە سەر بنوسن .بۆ نمونە من بازنەیەکم بـۆ هاورێیـانم لـە کـورد ئـایتیپیگرووپ دروست کردوە و ئەیانخەمە ناو ئەم بازنە بە کرتەی دوگمەی لای چەپ لە سەر وێنەکەیان و راکێشانیان بۆ نێو بازنەکـە یـان ctrl ئـەگرم و کرتەیەک لە سەر هەر وێنەیەک ئەکەم تا نیشان بکرێن پاشان بەجارێک هەرهـەموویان رادەکێشـمە نـاو ئـەو بازنـە نـوێ یـە کەدروسـتمان کردووە.






تێبینی :بازنەکان خۆکارانە لە سەر پیتی ئەلف و بێ ریزبەند دەبن وەهەمیشە بازنە ئامادەکـان لـە سـەرەوە جێگیـر دەبـن.ئەگـەر دەتانەوێت بەشێوێن کەسانی ناسراو بە ناوبانگ دا بگەرێن دەتوانن لە مێنیۆی سـەرەوە لـە بەشـی Find people بـەدوایان دا بگەرێن:

Your circles (2) | Have you in circles (0) | Find people | All suggestions | Type a name

دەتوانن بازنەیێکی تایبەتیان بۆ دروست بکەن یان بیخەنە نێو بازنەکانتان بە پێی زانیاریـەکانیان و لـە نوسـراوەکانیان وزانیاریەکانیان ئاگادار بن.

## ٥-٢ :چۆنیەتی چاکسازیکردن لە بازنەکان دا :




بەکرتەکردنەسەر هەر بازنەیەک دەتوانرێت ئەندامانی ناو ئەو بازنەیە بسـرینەوە یـاخود هەر گۆرانکاریەک کە بمانەوێت چاکسازی تێدابکـەین هـەروەک لـەم وێنـەی لای چـەپ دەردەکەوێت کەپێکهاتووە لە ( هێمای تەنکەی خۆڵ بۆ سـرینەوە، هێمـای پێنـووس بـۆ دەستکاری، هێمای ناوەندی بۆ هاوبەشی لە تۆڕ).

بۆ سرینەوەی ئەندامانی بازنەش لە سەر وێنەی هەر کامێکیان نیشانگەری مشکەکە دابنێیت هێمـای x دەردەکـەوێت بەکرتـەکردن لەسـەری ئەو ئەندامی بازنەیە دەسرێتەوە.




تێبینی : تەنها سنوورێک کە گوگڵ پلاس هەیەتی هێزی بیرۆکەی بەکارهێنەرە، و هەرکارێکتان پێویستە لە تۆرێکی بەهێز دەتوانن ئەنجامی بدەن بۆ نمونە:

لایەنگری وەرزشیت بازنەیێک بۆ وەرزش بەتایبەت تیمەکەت دروستبکە.

مامۆستای بازنەیەک بۆ خوێندکارەکانت دروست بکە.

پزیشکیت بازنەیەک بۆ نەخۆشەکانت دروست بکە.

خێزانەکەت زۆرە بە سانایی بازنەیەک بۆ هەر خێزانێک دروست بکەو زانیاریەکانت تۆمار بکە.

### ٦-چات :

سەرجەم ئەو توانایەی کە لەجی مەیل ( G-mail)  داهەیە ئەوا لە گۆگڵ پلاس دا هەمان توانا دەستەبەر کراوە.

### ٧-Stream :

ستریم یان ڕەوت بە کرتە کردن  لە سەر هێمای home لە شریتی مینۆی گوگڵ پلاس دەبیینن .کـاری ئـەم ڕەوتـە یـان سـتریم چیە؟پەرەی سەرەکی گوگڵ پلاسی ئێوەیە وەکو دیواری فەیسبووک کە دەتوانن زانیاری خەڵکی دی ببینن وزانیاری خۆتان بنوسن .لـە نـاو ئەو لاکێشە سورەدا کە هەر وەک لەوێنەکەدا دیارە لە بەشی ستریم  ئەم وشـانە دەبینـن names, circles, or email addresses ، کاری ئەم وشانە چیە ؟




کاتێک ئێوە بابەتێک ئەنوسن ودەتانەوێت بڵاوی بکەنەوە ئەتوانن بابەتەکە لەگەڵ کەسێک (names) یـان بازنـەکان(circles) یان ئادرەسی ئیمەیلێک(email  addresses) هاوبەش بکەن. بۆنمونە من پێم خۆشە نوسراوێک بـۆ براکـەم بنێـرم ئـەوکات کرتەیەک لە سەر وشەی names  ئەکەم پاشان لە لیستەکە دا بۆی دەگەڕێم لەپاشـان دا بازنـەکان و هاوڕێیـانی تـر ئـەم بابەتـە نابینن (ئەمەیە پاراستنی زانیاری لە تۆڕی گوگڵ).

یان ئەگەر بمانەوێت  بابەتێک کە لە ماڵپەرێک سەرنجراکێشە تەنانەت بۆ ئەندامانی ئەو بازنە(کوردئایتیگرووپ) بڵاوی بکەمەوە :




ڕێگـەی یەکـەم لـە ڕێگـای تـۆڕی گوگـڵ پـلاس لـە سـەر ستریمەکەم:بابەتەکەم ئەنوسم و بازنەکەی بۆ دیـاری دەکـەم پاشان لەسەر تۆڕی کۆمەڵایەتیەکەم بڵاوی دەکەمەوە.

ڕێگەی دوهەم لە ماڵپەڕی فەرمی ، بابـەتێک بـۆ سـتریمەکەم دەنێرم:لە ڕێگەی دۆگمەی هاوبەشی گوگڵ پلاس لە ماڵپەڕەی فەرمی (کوردئـایتیگرووپ )وەک وێنـەی خـوارەوە بازنـەی ئەندامانی کورد ئایتی بۆ هەڵدەبژێرم.لە نوێکاری لە سەر دوگمەی١+g لیـستێکتان لـە بابەتـەکانی ماڵپـەڕی بابـەت پـێ پێشـنیار دەکات بۆ هاوبەشکردن .بەم جۆرە تەنیا کرتە لە سەر دوگمـەی+g بوەسـتێنە. کاتێـک کرتـە لـە سـەر دوگمـەی+g دەوەسـتێنیت لیستێکتان بۆ دەکاتەوە ئەو کەسە کە ئەوبابەتانـەی هاوبەشـکردوە نیشـان ئـەدات هەروەهابـە ئێـوەش پێشـنیاری خوێنـدن وهاوبـەش کردنـی بابـەتی تـر ئـەدات ئینجا کرتـەیێک لـە سـەردوگمەی+g بکـەن بازنـەیێک بـۆ هاوبەشـی هـەڵبژێرن و بینێـرن بـۆ ستریمەکەتان لە تۆڕی گوگڵ پلاس.



## ٨- هاوبەشی زانیاریەکانمان:

لەگوگڵ پلاس وەکو ئاو خواردنەوە ئەتوانین زانیاریەکانمان کە بریتیە لە وێنە ،بابەت،پەرگەی موسیقا و ڤیدیۆ بلاو بکەینەوەباشە چۆن: ڕێگای یەکەم کاتێک دێنە نێو هەژمارەی گوگڵەکەتان لە شریتی سەرەوە کرتەیەک لە " share+ " بکەن




زانیارەکەتان تۆماربکەن ئەگەر لە گەڵ وێنە یان بەستەر یان ڤیدیۆ بوو ئەویشی پێوە هاوپێچ بکەن وهاوبەشی بکەن(پەڕگەکان لـە نێو کۆمپیوتەرەکەتان دا بکێشنە ناو بەشی stream یان ڕاستەوخۆ خۆی بە سادەیی باری دەکات.لە هـەر جێگەیـەک بنوسـین سنوری تایبەتیتان پارێزراوە و دڵگران مەبن (ژمارەی ٧ بخوێنەرەوە بۆ جارێکی تر).

ڕێگای دووهەم بەچوونە ناو پەڕەی سەرەکی گوگڵ پلاس و لە ڕێگای stream مکەتان.




ژمارەی ٢ : بابەتێک بنوسن(چیرۆک،بیرۆکە،ڕوداوێک....هتد)

ژمارەی٢ :وێنە بە نوسراوەکەتان زیاد بکە (لە ڕێگای موبایل،بارکردنی نێو کۆمپیوتر،گالێری دروستکردن و وێبکام)

ژمارەی٣ :ڤیدیۆ بە نوسراوەکەتان زیاد بکە (لەڕێگای بارکردنی ڤیدیۆ،یوتیوب،موبایل،ڤیدیۆ گرتن بەوێبکام)

ژمارەی٤ :ئەم بەشە لە پەڕەی—شرۆڤەی لە سەرکراوە.

ژمارەی٥ :بەستەر یان لینک بنوسە(شرۆفەو وێنەی بەستر دەردەکەوێت)

### ٨-١ : داخستنی بابەت و ناچالاک کردنی لێدوانەکان :

ئەم دوو توانایەی کە لە گوگڵ پلەس دا هەیە لە فەیسبووک تائێستاش بەخەو نەبینراوە .داخستنی ناردراوە و ناچالاک کردنی لێدوانەکان یان بۆچوونەکان ئەم دوو کردارە لە لای ڕاستی هەر stream یێک دەردەکەوێت.

تێبینی: داخستنی بابەت ( Lock this post ) بۆ ئەوەیە کە پێتان خۆش نیە ئەندامێکی تر بابەتی ئێوە هاوبەش بکات یان شێری بکات بۆ ئەندامانی تریان لە نێو بازنەکانی خۆیدا.

ناچالاککردنی لێدوان ( Disable Comments ) بۆ ئەوەیە کە هیچ کەس نەتوانێت لێدوان بۆ بابەتی ئێوە بنوسێت .

kurdpdf -qezwan 3:09 PM - +1'd on kurditgroup.org - Limited

Edit this post

Delete this post

Disable comments

Lock this post

Add a comment...

لەبیرتان بێت کە داخستنی بۆچوون یان لێدوان ،بۆچوونەکانی پێشتر ناسڕێتەوە تەنها ڕێگە بە نوسین و بۆچوونی نوێ نادات.ئەگەر گەرەکتانە بۆچوونێک بسڕنەوە نشانەی مشکەکە بخەنە سەری وتەنها کرتەیەک لە سەر هێمای x بکەن یان بیخەنە نێو لیستی ڕەش یان بیسرنەوە .

### ٢-٨ :Hashtags#

ئەگەر لە تۆری کۆمەڵایەتی تویتێر خۆتان تۆمارکردبێت و تویتتان نوسیبێت،بە دڵنیایی لە گەڵ hashtag وکرداری ئاشنایەتیتان هەیە.کاتێک بۆ وشەیەکی دیاریکراو لە خشتی گەڕانی گوگڵ پلاس دەگەڕێن دەتوانن بە نوسینی هێمای # وناوی دڵخوازیتان زانیارییێکی زۆر بەدەست بێنن یان کاتێک نوسراوێک هاوبەش ئەکەن یان لە ستریم دەینوسن، بە نوسینی هێمای # و وشەی پەیوەندی بە بابەت ،ئەو نوسراوە زیاتر دەوڵەمەند دەکەن گوگڵیش پێشنیارێک لە تاکە وشەکانتان پێ ئەدات.بۆ نمونە ئەمن بۆ نۆک دەگەڕام ئەم تاگانەم لە نۆک پەیدا کرد لەم نوسراوە !

Brwa Osman Jul 18, 2012 - Public

Having Nokaw at Sarchinar :) 5:00 am

#Nokaw #Sarchinar

### ٩ -دوگمەی ١+

کاری دوگمەی ١+ هەمان کاری دوگمەی like دەکات کە لە فەیسبووکدا هەیە، بە کرتە کردن لە سەر ئـەم دۆگمـە یـە دەنگدانـە بـە ماڵپەڕەکە ئەم دەنگدانە لە پەڕەی ستریمی ئێوە نیشان دەدرێت و تەنانەت لـە بەشـی پرۆفایـل سەرخشـتی ١+یـش دەردەکـەوێ هاورییانتان ئەتوانن ببینن.ئەگەریش پێتان باشە لینکی ماڵپەڕ هاوبەش بکەن تەنیا لە ڕێگای سـتریم لینـک بنوسـن وهاوبەشـی بکەن.

### ١٠- گەڕانی کۆمەڵایەتی:

هەروەک ئاگادارن گۆگڵ خەریکە تەواوی خزمەتگوزاریەکانی تێکەڵ دەکات هەروەک دیـارە کـە گۆگـڵ پـلاس لـە سـەرەوەی ئـەم ئێکۆسیستەمە جێگیر کراوە کاتێک ئێوە لە مۆتۆری گەڕانی گوگڵ بەشوێن شتێک دەگەڕێن ئامانجی گەڕانەکە بەم سێ شـێوازەی لای خوارەوە دەردەکەوێت :

١ – گەڕانی تایبەت

٢ – پرۆفایلەکان

٣ – بەکارهێنەران وپەرەگەکانیان

لە وێبلاگی فەرمی گوگڵ:

- گەڕانی تایبەت بۆ زانیاریەکانتانە کە لە پرۆفایلەکەتاندا کە هاوبەشتان کردوە.
- ئەو کەسانە ی کە ئارەزوودەکەن بیان دۆزنەوە یان هاورێکانتان نیشان ئەدات.

ئەو ئەندامانەی کە پەسەندکراون لای ئێمەوە ، ڕێگەمان پێ دەدات کە پەرگەکانیانمان دەست بکەوێت.



ڕێکلام :

## ١١- وێنە:

بەتەنها کرتەیەک لە سەر مێنیۆی پرۆفایل(لە سوچی چەپ) دەچنە ناو پەڕەی پرۆفایل و لە خشتی photoes وێنەکانتان کە لە سەر ستریم یان بۆ تۆڕی گوگڵ پلاسەکەتان کە بارتان کردوە دەبینن:




کاتێک کە دەمانەوێت وێنەیەک بار بکەین یان بخەینەئەلبومی گەلەری یەوە ئەوا کرتەیەک لەسەر دوگمەی UPLOAD NEW PHOTOS پەڕەی photos دەکەین ئینجا ئەچینەی بەشی بار کردنی وێنە :
لەم پەڕە وێنەکانتان لە چەند بەشی جیاواز دابەشدەکرێن:کەبریتیە لە

- بەشی وێنەی موبایل
- بەشی وێنەی کۆمپیۆتر(گەلەری یان ئەلبومەکان )
- بەشی وێنەی بابەتەکانتان
- بەشی وێنەی بازنەکان
- بەشی وێنەی خۆتان



لێرەش وەكۆ ناردراوەكانتان لە بەشی سەرەكی پرۆفایلیكەتان  زۆر سنوردار و  تایبەتە بە خودی خاوەن پرفایلەكـەو زۆر بـە بە وردی كە دەتوانرێت جاودێری و  كۆنترۆڵی سەرجەم وێنەو بابەتەكان بكرێت لە دەستنیشـانكردنی كەسـانی رێگەپێـدراو یان سنورداركردنی كەسەكان لە دەستگەشتنیان بە و تایبەتمەندیانەیـەكانتان، بەتـەنها كرتەیـەک لـە سـەر ئـەم هێمایـە لـە خوارەوەی وێنەكان ئەو كارەتان بۆ بەئەنجام دەگەیەنێت.

لەپاشان دا كرتە لە سەر بار كردنی وێنەكان دەكەین ، وەپاشانیش وێنەكانمان هەڵدەبژێرین لە نێو كۆمپیوتەرەكانمان وێنەكان بار دەكرێن(لە پێگەی Album name و ناوێک بۆ ئەلبومی وێنەكانمان دیاری دەكەین :




وێنەكان باركراون و پاشان كرتەیەک بكەن لە سەر دوگمەی Create album



لە قۆناغی کۆتایی پرسیارێکتان سەبارەت بە نوسینی تاگ بۆ وێنەکانتان لێدەکات بەواتە بـۆ پەیـدا کردنـی ئـەو وێنەیـە لـە مۆتۆری گەڕان یا خشتی گەڕانی گوگڵ پلاس یان کاتێک نیشاندەری مشکەکەتان دەخەنـە سـەر وێنەیـەک و ناوێـک دیـاری بکرێت ، یان دەتوانن ئەمکردارەی لە سەر نەکەن و کرتە بکەنە سەر دوگمەی skip tagging:

Upload and share photos

Help people tag you in photos

By turning on Find My Face, Google+ can prompt people you know to tag your face when it appears in photos.

Of course, you have control over which tags you accept or reject, and you can turn this feature on or off in Google+ settings. Learn more

Turn on Find My Face | No, thanks

Is this qezwan kurdistan?

Step 1. Click photos of the same person

Step 2. Tag who they are

Click on photos to the left to start tagging

Done tagging | Skip tagging | Cancel

Adding tags will notify the people you have tagged. They will be able to view the photo and the related album.

دوای ئەم قوناغە کاتی ئەوە هاتوە کە ئەلبومەکەتان هاوبەشی پێبکەن  بۆ سەر بازنەکانتان بۆ نمونە من دەمەوێت ئەم ئەلبومە تەنها هاورێیانی ناو بازنەی کوردئایتیگرووپ ببینێت.

Share album "May 27, 2012"

ئەمە بۆ ئازموونە

کوردئایتی گرووپ

Your circles

Public

Extended circles

Friends (0)

Family (0)

Share | Cancel

هەر وا دەزانن کە خزمەتگوزاریەکانی گوگڵ تێکلاو بوە کە دەتوانن ئامرازەکانی دەستکاری وێنەی Picasa بە باشی بکار بێنن.ئەمەش ئەلبومە دروستکراوەکەی ئێمەیە.




**بۆ زانین لە وێنەی سەرەوە:**

ژمارەی ١ :لەم بەشەدا ئاماژە دەکات کە ئەم گەلەریە تەنها بۆ ئێوە هەیە بیبینن نەک ئەندامانی تر وەهەروەها  ئاماژەدەکات بەژمارەی وێنەکانی ناو ئەم بەشە کە تەنها ٦ وێنەی لەخۆگرتووە .

ژمارەی ٢ : لەم بەشە دا دەتوانن هاوبەشی بکەن لە نێو بازنەکانتان.

ژمارەی ٣ : لەم بەشەدا دەتوانن وێنەی جیاواز کەلە کۆمپیوتەرەکانتانایە بخەنەنێو ئەم ئەلبومەوە.

ژمارەی ٤ :دانان یان نوسینی تاک لە سەر هەر وێنە.

ژمارەی ٥ : کاری زیاتر بۆ ئەلبومەکەتان.

ژمارەی ٦ : کاتێک هێمای مشک دەخەنە سەر هەر وێنەیەک ئەو دوگمانە دەردەکەون کە دەتوانن وێنەکان هاوبەش بکەن یان پەسەندی بکەن (لایک).



## ١-١١ : وێنەی بازنەکان:

بۆ بینینی ئەو وێنانەی کە هاوڕێکانتان بۆیـان نـاردوون ، ئـەویش بەکرتەکردنسـەر وێنەکـە دەبینـین وێنەکـەمان لەقەبارەیـەکی بچوکەوە دەگۆڕێت بۆ قەبارەیەکی گەورەتر، وە پاشان دەتوانین بۆچوونی خۆتانی لەسـەر تۆماربکـەن. ئـەم وێنانـە دەتوانرێـت چەند کردارێکی لەگەڵ بکرێت بۆ نمونە دەتوانین وێنەکان بنێرین بۆ گۆگڵ +١ یـان دەتـوانین هاوبەشـی پـێ بکـەین ، جگەلـەو کارانەی باسمان کرد دەتوانین لە مینۆی options دا راپۆرتی بکەین بۆ بەرێوەبەرانی گۆگڵ پـلاس، یـان لەسـەر بازنـەکانمان بیان سڕینەوە.

## ٢-١١ :وێنە لە ڕێگای ئامێری موبایل:




ئەگەر تەلەفۆنی دەستی ئایفۆن یان ئەندرۆیـد بـەکاردەهێنن دەتـوانن زۆر بـەخێرایی سـوود وەرگـرن لـە توانـایی Instant Upload ئەویش بەچالاککردنی مۆبایلەکانتان وە پاشان وێنە یاخود کرتەیی فیدیۆیی بگرن و بەشێوازێکی خۆکارانە لەرێگەی مۆبایلەکانتانەوە بگوازرێتەوە بۆ پرۆفایلەکانتان لە سەر تۆری کۆمەلأیەتی گۆگڵ پلاس. یەکێک لە کارەنایابـەکانی گۆگڵ پلاس هیچ سنور بەندیەک دیاری نەکراوە بۆ بارکردنی وێنەو کرتە فیدیۆیەکان، هەروەها ئێوە دەتوانن خۆتان پەرگەکانتان بەجۆرێک رێـک بخەن کە چۆنتان پێخۆشە لەدیاری کردنی ئەو کەس و لایەنانەی کـە بتـوانن وێنـەکان و کرتەفیدیۆیـەکانتان ببینـن ئـەویش بـە ناچالاککردنی ئەم توانایەی مۆبایلەکانتان. بارکردنی بێ سنوور پەرگەکان . پەرگەوێنەکان لە قەبارەی ٢٠٤٨*٢٠٤٨ بـە شـێوەی خۆکارانە قەبارەکەی دەگۆرێت.ڤیدیۆکانیش بە ماوەی١٥خولەک بە کوالێتی1080p.ئەگەر قەبارەی وێنەکان زیـادتر بوودەتـوانن سوود وەربگرن لە بەکارهێنانی بەرنامەی Picasa 3.9 بۆ ئەوەی پەرگەکە لە بیرگەی گوگڵ بمێنێت.

## ١٢-Hangouts :

HANGOUTS



Start a hangout
Invite your friends

Hang out




باشترین بەشی گوگڵ پلاس کە لە پەڕەی سەرەتایی ستریمەکەتانە کە هاوکات ئەتوانن لە گەڵ ٩ هاوڕێتان بە ڤیدیۆ چات بکەن ئەڵبەت لەبیرتان بێت کە پێشتر بۆ ڤیدیۆ کونفرانسێک چەندە پارەتان خەرج ئەکرد بەڵام بڕیار دراوە کە بۆ ئەم توانایەی گوگڵیش سنورێک نەمێنێت. چالاککردنی چاتی دەنگ و ڤیدیۆیی دەبێت Hangouts وە هەریەک لە زیادکراوەکانی Google voice و Google video هەڵدەبژێرین و گوگڵ پێشنیاری داگرتنی ئەم تایبەتمەندیەمان بۆ دەکات و پاش داگرتن و دامەزراندنی ئەم تایبەتمەندیە ئامادەدەبێت بۆ بەکارهێنان ئەگەر پێویست بە ڕێکخستنی دەنگ و ڤیدیۆ نەبێت. لەدوا قۆناخدا دەتوانین هاوڕێکانتان ئاگادار بکەنەوەو هانیان بدەن بۆ چاتکردن.

پەنجەرەی Hangouts پێکهاتوە لە چاتی تاقمەکان،بەستەری بانگهێشت،Screenshare یوتیوب،Mask Effects (کە وێنەی دەموچاوی ئێوە ئەگۆڕن).Hangouts بۆ تەواوی بەکارهێنەرانی جیهانە و جیاوازی نیە لە چ وەڵات ونەتەوەیێک بن.هەر وا ئێوە ئەتوانن لە ڕێگای موبایل وتاتەبژمێرەکانتان لەم توانایەی گوگڵ سوود وەربگرن چالاکی Hangout لەدەست نەدەن.

### ١٣- گۆڕانی وێنەی کاوێر وپرۆفایل:

تا ئێستا نیوەی ڕێگاکانتان بریوە، ئێستا دەتوانن پرۆفایلەکەتان کەمێک جوان و ڕازاوە بکەن وگۆڕانکاری تێدا بکەن بۆ نموونە ئێوە دە توانن چاو لەم نمونانە بکەن کە ئەندامێک وێنەی خۆی کردوە بە بەنەر(بەیداخ)ی ماڵپەڕەکەی بەڵام کەسێکی تر کەمێ گرافیکی تێدا داناوە:




یان ئەتوانیت وێنەکانتان بخەینە پشت کاوێرەکەت وەك ئەم نمونەیە:



## ١٣-١:چۆن وێنەیێک لە سەر کاوێرەکەمان دابنین:




کاتێک کرتە لە سەر هێمای پرۆفایل بکەن ئینجا لە سەر دوگمەی Edite profile کرتە بکەن تا لە سەر بەنەری پرۆفایلەکـەتان ئەم رەستەیە دەردەکەوێت Change cover photo پەنجەرەیێک دەکرێتەوە کە خۆی وێنـەی ئامـادەکراوی تێـدا هەیـە یـان ئەگەر وێنەی ئامادەتان پێ جوان نیە لە سێ رێگای تر ئەتوانن وێنە بخەنە سەر کاوێرەکەتان:




-وێنەی تایبەت بار بکەن(upload)

-وێنەکان کە پاشتر بارتان کردوە( Your photos)

وێنەکانی کاوێر کە پاشتر بارتانکردوە (Cover photos)

کاتێک کە وێنەیێکتان هەڵبژارد لە سەردوگمەی **edit done** کرتە بکەن بۆنمونە وێنەیێکم لە گالێری هەڵبژارد بۆ کاوێرەکەم :




گۆرانی وێنەی پرۆفایلیش هەر وەک وێنەی کاوێری پرۆفایلەکەتانە.

## ١٤- چۆن پرۆفایلەکەم لای ئەندامەکانی تردەردەکەوێت ؟

ئەگەر پێتان خۆشە کە بزانن ئەندامانی ترو تەنانەت ئەندامانی نێو بازنەکەتان چۆن پرۆفایلی ئێوە دەبینن؟ بۆ نمونە کرتەیەک لە سەر دوگمەی ...view as پاشان بۆ ئەندامی گشتی public هەڵبژێرن وبۆ ئەندامانی تر لە ناو خشتەکە نێوی هەژمارەکەی تۆماربکەن.



بۆ لابردن و ناچالاککردنی ئەم بارەش هەر لە سەر دوگمەی view کرتەیێک بکەن ئینجا بەستەری Stop viewing as Public هەڵبژێرن.

## ١٥- پەڕەی ڕێکخراوەکان :

بۆ ئەوەی تایبەتمەندی خۆتان لە سەر پرۆفایلەکەتان ئەنجام بدەن بە یەکێک لەم دوو ڕێگە ئەتوانن برۆنە نێو پەڕەی ڕێکخەراوەکان یان : setting

ڕێگای یەکەم بەم ئادرەسە:https://www.google.com/settings/plus

ڕێگای دووەم وەک ئەم وێنەیە:



لە پەڕەی + Google چەند زانیاریمان پێ ئەدات بە کورتی:

بۆ نوسراوەکانمان:

--کێ ئەتوانێت ئاگاداریم بۆ بنێرێت.

--کێ ئەتوانێت بۆ گشتی نوسراوەو ناردراوەکانم لێدوانم بۆ بنوسێت.

-- کێ ئەتوانێت لە ڕێگای پەیامنێر چاتم لە گەڵ بکات

١- هەموو کەس(Anyone)

٢- بازنەکانت (Your Circles)

٣- تەنیا خۆم (Only You)

٤- درێژکراوەی بازنەکان(Extended circles)

٥-شێوازی تر (Custom)

تێبینی: Custom له گشتی نەرمترە بۆ ئەوە کە ئەتوانن بازنەیێکی بۆ دیاری بکەن کە نوسراوەکانی پرۆفایلەکەتان ببینێت یان بازنەیێک تایبەتی بۆ زیاد بکەن.




## Notification delivery

کاتێک کە چالاکی لە سەر پرۆفایلەکەتان ئەبێت وەکو ١+(لایک) یان لێدوانی سەر نوسراوەیێکتان چۆن ئاگادار بن ؟ لێرە هەم لە رێگای sms هەم لە رێگای ئیمەیل کە ئەتوانن ئیمەیلێر بناسێنن

## Manage email subscriptions

ئەم بەشە هەواڵنامەیێکە بۆ
ئاگاداری چالاکی ئێوە لە رێگای گوگڵ پلاس وپێشنیاری گرتنی هاورێیان.
بەرۆژ بوونەوەی ئەندامان لە دەروەی بازنەکانتان.

## Receive notifications

لێرە ئەتوانن لە هەر چالاکی کە لە خوارەوە هاتوە ئێوە لە رێگای ئیمەیل یانsms کورتە پەیام ئاگادار ببنەوە.

### Posts

- ناوبردنی ئێوە لە نوسراوەیک.
- هاوبەشی نوسراوێێک لە گەڵ ئێوە.
- ناردنی بۆچوون بۆ بابەتکی ئێوە.
- ناردنی لێدوان بۆ بابەتێک کە ئێوە بۆچوونتان بۆ کردوە.

### Circles

- زیاد کردنی ئێوە بە بازنەیێک.

### Photos

- تاگ کردنی ئێوە لە وێنەکان.
- تاگ کردنی وێنەکانی ئێوە.
- ناردنی بۆچوون بۆ وێنەیێک کە لێدوانتان بۆی نوسیوە.
- ناردنی بۆچوون بۆ وێنەیێک کەتاگتان کردوە.

### Messenger

- دەستپێکردنی چات لەگەڵ ئێوە.

## Events

- بەرۆژ کردنی و بانگهێشت بۆ ڕووداوەکانم.
- بیرخستنەوەکانم بۆ ئەو ڕوداوانە کە بانگهێشت کراوم.
- چالاکی لە سەر ئەو ڕوداوانە کە چالاکم لە نێویان.

**Communications about Pages**

بێڵن کە ئەم بەشە گشتی نیشانە بکرێت .

## Google +1

گوگڵ بە ئێوە ئەو توانایيە ئەدات تا هەر کات پێتان خۆش بوو تايبەتمەندیکانی +1 و پرۆفایلەکەی ئێوە لە ڕێکلام وپەرەکانی تر بخاتە ڕوو بەڵام هاوبەشی ناکات(ئێوە ئەتوانن ئەم توانايیە چالاک بکەن بەڵام با ڕۆشن بێت وبتوانی گوگڵ سوودی لێوەربگرێت).

## Google+ Pages

ئەتوانن هەر کات ئێوە (+ وناوی پەرەیێک) ئەگەڕێن گوگڵ بیخاتە نێو بازنەیێکتان.

## Google+ games

نیشاندانی یاریە بەرۆژ کراوەکان لە شریتی لاتەنیشتی پرۆفایلەکەتان

## Your circles

لێرە ئەتوانن ئەو بازنانە کە پێتان خۆش نیە زانیاریەکانتانی لەگەڵ هاوبەش بکەن هەڵبژێرن.بۆ وێنە ئەمن پێم خۆش نیە زانیاریکانم(وێنە،ڤیدیۆ،نوسراوە....)خێزانەکەم ببینێت و ئامژەی چوارچێوەی خێزان لادەبەم.




## Photos

لێرەش ئەتوانن ئەم ڕێکخراوانە بە گوگڵ بناسێنن کە پێتان خۆشە وێنەکان چۆن بن:

- نیشاندانی زانیاری جوگرافیایی و شوێن بۆ وێنە وگالێری تازە.
- توانایی داگرتن وێنەکان لە لایەن ئەندامان و ئەو کەسانە کە سەردانی گالێریەکەتانیان کردوە.
- پەیدا کردنی وێنەی دەموچاوی من وتاگ کردنی دەموچاوم لە لایەن ئەندامانی تر.

## Disable Google+

ئەتوانن هەژمارەی گوگڵ + ناچالاک بکەن ودايبخەن.

### ١٦- نیشاندانی ناوەڕۆک وبابەتی بازنەکان:

بۆ ئەوە کە لە پەرەی سەرەتایی دەستنیشانی  بکەین چەندە بابەت لە پەرەی سەرەتایی نیشانبدرێت کرتەیێک لە سەر هێمای Explore لە سوچی چەپ بکەن

**No** What's hot posts on your Home page

**A few** What's hot posts  on your Home page

**Some** What's hot posts  on your Home page

**Even more** What's hot posts  on your Home page

## ١٧- پەڕەكان page:

ناوەرۆكی گوگڵ پلاس بەكارهێنەران وئەندامانین.بەم هۆیەش پێش دروستكردنی پەڕەیێكی تایبەت بە كـار وخزمەتگوزاریەكـەتان یان تیمێكی وەرزشی یان...هتد دەبێ لەسەرەتادا گوگڵ پلاس خۆتان تۆمار بكەن وپرۆفایلەكەتان رێكبخەن وئینجا پـەڕەی ئامـادە بكەن بۆ هەر شتێك كە بیری لێ دەكەنەوە و پێتانخۆشبێت.بۆ ئەم مەبەستە كرتەیەك لە سەر ئـەم هێمـا بكـەن لـە سـوچی چـەپ شریتی ئایكۆنەكان ئینجا كرتە بكەنە سەر دوگمەی Create new page .




كاتێك كرتەتان كردە سەر دوگمەیCreate new page  دەچنە ئەم پەڕە گەیەوە هەروەك لەوێنەكەی لای خوارەوەدا دیارە.



### تاقمەیێك هەڵبژێرن (Pick a category):

### Local Bussiness or Place:

ئەتوانن بۆ فرۆشگا یان نوسینگەكانی خۆتان پەڕەیێكی تایبەت دروست  بكەن  كەتەنها ژمارەی تەلەفۆنی پێویستە.

### Product or Brand:

ئەتوانن بۆ (برەند) بەرهەم و خزمەتگوزاریەكانتان ماڵپەرەكانتان...هتد پەرەكان دروست بكەن وبۆ ئەوە كـێ بتوانێـت ببینێـت رێكی بخەن وەك ئەوە +١٨ یان +٢٠ یان +٣٠ ساڵ یان تەواوی ئەندامانی گوگڵ پلاس.

## :Company Instituttions or Organization

ئەمەش  بۆ دامەزراوەکان،کۆمپانیاکان و قوتابخانەکان باشترە وە ئەتوان کە چ بەکاربەرێک ببینێت ڕێکیبخەن.تـەواوی ئەنـدامان یان +١٨.

## :Entertainment,Arts and sport

موزیک،فیلم،کتێب،تەلەفزیۆن،بەرنامەی وەرزشی لەم تاقمەیدان وەک بەندەکانی پێش سنوری دیتنی بۆ دابین ئەکەن.

## ئەوانی تر:

ئەگەر پەرەکەتان لە بەندەکانی سەرەوە ناگونجێت ئەوە  otherهەڵبژێرە پاشـان خشـتەکان پـر بکـەرەوە ئەچیتە پـەرەیێکی تـر بەناوی Profile  basics لە خشتیەی TALINE وشە ١٠ بـۆ پـەرەکەت بنوسە ئینجـا لـە بەشی  PROFILE  PHOTO وێنەیێک بۆ پرۆفایلی پەرەکانتان بار بکەن دەبێت لەیادمان نەچێت کە قەبارەی٢٥٠ * ٢٥٠ پیکسێلی .لە قۆناغی کوتاییدا ئەتوان پەرەکەتان هاوبەش بکەن(+Share  on  Google) یان دوگمەی کوتایی دابگرن  Finish ئێستا پەرەی تایبەت بە کتێبخانەکەم تەواو بوو.




لە ژمارەی ١و٥ ئەتوانن هەڵبژاردە بکەن کە بچنە نێو پرۆفایلەکەتان لە ژمارەی ١ تەنیا کرتە بوەستێنن ولە ژمارەی ٥ بەتەنیا کرتەیەک بکەن (وێنەی خوارەوە)




ژمارەی ٣ بۆ پەسەندکردن یان لایک کردن و ژمارەی ٤ بۆ هاوبەشکردنی بازنەکانیان لە لایەن بەکارهێنەرانیەوە .تەواوی تواناکانی تری پەڕەی گوگڵ پلاس وەکو بابەتەکانی پێشترە تەنانەت ئەوە بزانە کاتێک کرتە لە سەر ئایکۆنی page ئەکەیت هەر پەرگەیەکتان دروستکردبێت تێدا دەردەکەوێت.




## ١٨- یارییەکان :

گوگڵ بە بەردەوامی خەریکی زیادکردنی یاری نوێیە کەتایبەتە بەم بەشە، بۆ جونەناو ئەم بەشەکرتەلەسەر هێمای games بکەن لەشریتی چەپی پرۆفایلەکەتان یان ئەگەر لەم شریتە دەرنەکەوتە لە بەشی more کرتەیەک لە سەر هێمای game بکەن.



بەکورتی  لەم بەشەدا کۆمەڵێک یاری جۆراو جۆری لەخۆ گرتـووە هـەربۆ نمونـە یاریـە خێزانیـەکان ، یـاری وەرزشـی و یاریـە رکابەریەکان و .....هتد  بەرزکراونەتـەوە.  بـۆ چۆنیـەتی یـاری کـرد دەتـوانن یاریـەک هـەڵبژێرن وکرتەیـەک لـە سـەری بکـە پەنجێرەیەکت بۆ  دەکرێتەوە ولە سەر دوگمەی Got it, let's play کرتە بکەن ئینجا وەک وێنەی خوارەوە کرتەیەک لـە سـەر دوکمەیAllow access بکە و پاشان دوکمەی Continue کرتەبکە بۆ دەستبەکاربونتان بە یاریکردن.




دەتوانن لەگەڵ هاوڕێکانتان یاری بکەن بە ئەویش بە بانگهێشتکردنیان بۆ ئەو یاری یەی هەڵتان بژاردووە.

تێبینی:لە بەشی راست سوچی خوارەوە(Your circles played) ئاگادارتان ئەکاتەوە کە هاورێکانتان لە نێو بازنەکان کە کامەیاریان کردوە.

### ١٩-ئەپلیکەیشێن بۆ موبایل



هەر وا کە چاوەروان بووین ئەپەکانی گوگڵ پلاس بۆ تەلـەفۆنی ئـایفۆن وئەندرۆیـد توانـایی وەک وەشانی دسکتۆپی هەیە ودەتوانن بە سـادەیی سـوودی لێـوەربگرن بـەڵام Hangout تەنیا لە سەر ئەندرۆیدی وشانی سەروو ٣.٢ کار دەکات.

### Messenger-٢٠

Messenger ئـەپێکی پـەیام نێـری گشـتی گوگـڵ +١ کـە کاتێـک پـەیامێکتان بـۆ کۆمەڵێک (گرووپێک) نارد و وەڵامتان وەرگرت ئەتوانن‌وەڵام بۆ هەموو هاورێیـانی نـاو بازنەکانتان بنێرن ئەم توانایەش بۆ کاتێک باشـە کـە گەرەکتانـە بەرنامـەیێکی گشـتی دانێن و رێکبخەن.

### ٢١- فێرکاری و فەرمانەکان

بۆ ئەوانەی کەدەیانەوێت فەرمانێک بە زمانی html بزانن بۆ ئەوەی کە نوسینەکەتان جوان بکەن ئەم فەرمانانە فێر بە:

*bold* دەق یان وشە قەڵەو دەکات **bold** .

_italics_ دەق یان وشە لار دەکات *italics* .

-strikethrough- دەق یان وشە ئەکات بە هەڵە ~~strikethrough~~

### ٢٢- Hotkeys یان کلیلە خێراکان:

کاتێک کار بە گوگڵ +١ دەکەیت ئەگەر کاری دوکمەی تەختەکلیل بزانی باشتر وخێراتر لە گوگل+١ سوود مەند دەبیت ، هەر بۆ نمونە:

j : جولەی بۆ خواری پەڕە.

K : جولە بۆ سەرەوە.

Space :جولە بۆ خوارەوە page down .

Shift + Space : جولە بۆ سەرەوە page up.

@ و + : بەستەر ناردن بۆ بەکارهێنەرانی تر.

Q : کار لە سەر خشتی چات.

### ٢٣- زیاد کراوە بۆ وێبگەرەکان لە سەر گوگڵ پلاس:

زیاد کراوەکان بۆ ئەم تۆڕە وەک فەیس بووک زۆرە ئەتوانن لە گوگل بۆی بگەڕێن و لە سەر وێبگەرەکەتان دایمەزرێنن.

## ٢٤- ڕووداوەکان (Events):

ئەم بەشە بە تازەیی هاتوەتە نێو گوگڵ پلاس وەکوو ڕووداوەکانی فەیسبووکە بەڵام کەمێ باشتر و ڕێکو پێکترە. کرتەیەک لە سەر هێمای Events بکەن لە شریتی لاتەنیشت مێنیوکانی لای چەپ پاشان یەکێک لەم دوو ڕێگایە هەڵ دەبژێرین :١- لە سەر دوکمەی Create event ٢- هێمای مشک بخەنە سەر وێنەی کاوێژ تا بەستەرێک بەم ڕستەیە(Create an event with your friends) دەربکەوێت ئینجا کرتەی لە سەربکەن(وێنەی خوارەوە)

لەپاشان دا پەنجێرەیەکتان بۆ دەکرێتەوە وەکو popup کە ئەتوانن وێنە یان خۆد کاوێری بۆ هەڵبژێرن(change theme) وە هەروەها خشتەی سەردێر خشتەی ڕێکەوتی ڕوداوناوەڕۆکی ڕوداو یان بابەتخشتەی بانگهێشت یان ئاگاداری هاوڕێیانی ناو بازنە پڕ بکەنەوە ئینجا دوگمەی inviteیان بانگهێشت لێبدەن تا پەڕەی ڕوداوەکان دروستبێت.Event options هەر وەکو لە خوارەوە پێناسەمان بۆ کردوە.

بۆ ناسینی بەشێک لەدووگمەکانی ئەم بەشە:




دوکمەکان سەرەوە:

ژمارەی١ : ئەو کەسانە کە ئەم رووداوەت بۆیان ناردوە یان بانگهێشتان بۆیان کردوە.

ژمارەی ٢:ئەتوانن وێنەیێک زیاد بکەن تەنانەت بۆ ئەو هاورێیانەش کە سەردانی ئەم رووداوە ئەکەن.

ژمارەی٣ : هاورێیان یان خۆتان ئەتوانن ئەم رووداوە هاوبەش بکەن.

ژمارەی ٤ :Actions بەستەری پێمان ئەڵێت کە.




a) Event options کردارەکانی رووداو لە ژمارەکانی b و c مانا کراوەتەوە:

b) Guests can invite other peopleمیوانان بۆ ئەم رووداوە ئەندامی تر بانگهێشت بکە.

c) Guests can add photos میوانان وێنە بار بکەنە سەر ئەم رووداوەی من.

d) Manage guest list بەرێوەبردنی لیستی میوانان یان ئەوانەی کە بانگهێشتم کردوە.

e) Disable comments لێدوان ناچالاک بکەم.

f) Edit event دەستکاری رووداو.

g) Remove your photos سرینەوەی وێنەی رووداوەکان.

h) Delete this event سرینەوەی ئەم رووداوە بە گشتی.

ژمارەی٥ :لێرەش شێون وسەردێری رووداوەکانتان بۆ دیاری دەکات وە پرسیارتان لـێ دەکـات کـە یـا سـەردانی ئـەم جێگایـەتان کـردووە؟ وەڵامـەکانیش تـەنها بـە ( بـەڵێ یـاخود نـەخێر) دەبێتهـەروەها لـە بەسـتەری خـوارەوە کاتێـک کـەهێمای کرتـە دەخرێتەسەری بەستەرێک دەردەکەوێتCheck availability کە دەتوانن بگەرێن بە ناو رووداوەکانتان.

تێبینی :لە پەڕەی سەرەکی بەشی روداو زیادکراوە بە خشتەی نوسین وە بە سانایی ئەتوانن روداوکانی ژیانتان بنوسن ئـەویش بەتەنها کرتەیەک لە سەر هێمای روداوەکان بکەن.







ئەمەش یەکەم روداو یان کە بریتیە لەگەشت وگوزاری ئێوە لە پەڕەی سەرەکی events



## ٢٥- پرسیارەکان:

### ١- چۆنیەتی تاک یاخود Hashtags # دانان بۆ ئەو بابەتانەی هاوبەشیان پێدەکەم ؟

وەڵام بەکارهێنەری بەرێز لە ژمارە بابەتی ٨-٢ ئاماژەمان پێکرد.بە کورتی لە نێو خشتی نوسین یەکەم ئەم هێمای لە تەختە کلیلەکەت لێدە # ئینجا وشە بنوسە(گوگڵ خۆیشی پێشنیاری وشەت ئەداتی)




ژمارەی ١ : سوودم لە #Hashtags بۆ بابەت وەرگرتوە ئەمەش بۆ ناساندنی خێرا بە متۆری گوگڵ.

ژمارەی٢ : هاورێیان نێو بازنەکان لەم بابەتە ئاگاداردەکەمەوە.

ژمارەی٣ : بابەتێک کە هاوبەشی پێ دەکەم لە گەڵ وێنەکەی نیشان دەدرێت.

ژمارەی٤: ئەوکەسانە کە تا ئێستا هاورێم هەن بەڵام گوگڵ پلاسەکەیان چالاک نکردوە وئەم بابەتە نابینن.

لە پەرەی١+(کان) پرۆفایلەکەت بابەتی هاوبەشکراو ئاوا دەردەکەوێت :

تێبینی : هێمای X بۆ سڕینەوەی بابەتی هاوبەشی لە پرۆفایلەکەتە.



## ٢-کاتێک وێنە یان کۆمەڵەیێک وێنە بار دەکەم چۆن بیخەمە نێوان ئەلبۆمێک کە پێشتر دروستمکردوە؟

کاتێک کرتەت کردە سەر دوگمـەیUpload new photos لەپـەڕەی photos و پـەنجێرەی Upload and share photos کرایـەوە (وێنـەی خـوارەوە ) بەسـتەری add to an existing album هـەڵبژێرە تـاکو ئـەلبۆمـەکان کـە پێشـتر دروسـتتکردوە دەربکەوەن ئینجا ئەلبۆمێک هەڵبژێرە بۆ بارکردنی وێنەکانت.

Upload and share photos ×

Upload
From your phone

Album name: July 23, 2012 or add to an existing album

## ٣-چۆن وێنەیێک بسڕمەوە؟

کاتێک کرتە لە سەر وێنەیێک دەکەی پەنجێرەیەک دەکرێتەوە کە لە خوارەوەی وێنە کرتەیەک لە سەر بەستەری options بکەن ئینجا بەستەری Delete photoهەڵبژێرن.



### ٤-چۆن ئەلبۆمێک دابخەم یان تەنیا ڕێگەبدەم بە هاوڕێیانی بازنەیەک سەردانی بکەن وبیبینن؟

### سەرەتا ئەوە بزانە کە بە دوو ڕێگا ئەتوانیت بچیتە نێو ئەلبۆمی وێنەکانت :

یەکەم : کەرتە لە سەر هێمای profile بکە ئینجا پەڕەیphotos هەلبژێرە گەلەری ئەلبۆمەکانت دەردەکەون.

دوهەم : کرتەیەک لە سەر هێمای photos بکە ئینجا دوگمەی Albumsهەڵبژێرە کۆی ئەلبۆمی دروستکراوەت دەردەکەون.




نمونە: ئەلبۆمێکم دروستکردوە بەناوی Kurdish people کە ٥٧ وێنەی تێدایە و کلیلم نەداوە unlocked (وێنەی خوارەوە)




ژمارەی ١ : پێم دەڵێت ئەم ئەلبۆمە سنوردارە تەنیا بۆ بازنەکانی هەڵبژاردەی ژمارە ٢ کلیلم نەداوە وتەنها هاورێیانی بازنەکانی ژمارە٢ دەیبینن.

ژمارەی٢ :دەتوانم بازنەکان بۆ بینینی ئەم ئەلبۆمە زیاد بکەم یان کەمی بکەم.بە واتە کام هاورێیانێک رێبدەم سەردانی ئەم گەلەری یە بکەن.

ژمارەی٣ :هاوبەشی ئەلبۆم بە شێوازی بەستەرێکم پێ ئەدات.

ژمارەی٤ :ئەم ئەلبۆمە لە بنەڕەت دادەخەم.

## ٥- چۆن بەدوای پەڕەیەکی بەسوود دا بگەڕێم؟

کاتێک سەردانی پەڕە یان pageت کرد کرتەیێک لە سەر دوگمەی following لە لای سەرەوە بکە( وێنەی خوارەوە)، بەڵام هەرکات بابەتێک نوسرا لەم پەڕگەیەدا ئاگادار دەبیتەوە.




## ٦-بابەتەکانی گوگڵ پلاس چۆن هاوبەش بکەم لەگەڵ تۆڕەکانی تر وەکو فەیسبووک وتویتێر؟

زۆر بە ئاسانی تەنیا ئەم زیادکراوە دامەزرێنە سەر وێبگەڕی کرۆمەکەت .ناوەی زیادکراوە :

Extended Share for Google Plus پاشان دەتباتە پەڕەی زیادکراوە کە بێجگە لە تویێتر وفەیسبووك تۆڕەکۆمەڵایەتیەکانی ترت پێ پێشنیاردەکات دەتوانی نیشانی بکەیت ،بۆ هاوبەشکردنی بابەتەکانی گوگڵ پلاس لەواندا.




کاتێک زیادکراوەت دامەزراند برۆ نێو پرۆفایلەکەت و کرتەیێک لە سەر هێمای سێ گۆشەکە بکە(وێنەی خوارەوە)



## ٧-چۆن ناردنی پەیامی تایبەت چالاک بکەم لە سەر پەڕەی پرۆفایلەکەم؟

زۆر سادەو ساکارە برۆ نێو پرۆفایلەکەت وەک وێنەی خوارەوە کرتەیێک لە سەر دوگمەی Edite profileبکە




پاشان لە پەڕەی About خوارەوە کرتەیێک لە سەر دوگمەی Change contact settings بکە.




پەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە لەپاشان دا لێتدەپرسێت کە کێ بۆی هەیە پەیامە تایبەتەکانتان بۆ بنێرێت وسنوری بۆ دەناسێنیت بەواتەیێک تەنیا بازنەیێک پەیامت بۆ بنێرێت یان هەر کەس سەردانی پرۆفایلەکەت بکات یان....هتد.ئینجا کرتە لە سەر دوگمەی Done editing بکە(شریتی شین لە سەرەوە).

تێبینی :ڕەستەی دوهەم  لە کوتایی ئەم پرسیارە شرۆڤەی بۆ کراوە کە دەتوانی پەیام بۆ ئیمەیلی هاورێکت بنێریت




ئەمەش ئامانجی ئەم ڕێکخستنە بۆ ناردنی نامە تایبەتەکانتان بۆ ئێوە :



بێگومان لە لای ڕاست سوچی خوارەوە بەستەرێکیشت بۆ دەردەکوێت بۆ ناردنی پەیامی تایبەت: Send qezwan an email

کاتێ کرتە لە سەرهێمای ناردنی پەیام دەکەن پەنجەرەیەکی بچوکتان بۆ دەکرێتەوە کە دەتوانن پەیام بنوسن و هەروەها بەستەروێنەڤیدیۆو ڕوداویشی پێ زیاد بکەن. سەرە ڕای ئەمانەش ئەتوانن بۆ چەن هاورێیەکیتریش ئەم پەیامە بنێرن.




ئێستا لە نێو تەواوی هاورێکانتان تەنیا کاک جوتیار ئەم بابەتە کە بۆم ناردوە دەبینێت ولە پەڕەی پرۆفایلەکەم ئاوا دەردەکەوێت:



## چی بکەین باشە ؟ ئەگەر پێمان خۆش نەبێت نامە لە گۆگڵ پلەس نیشان بدرێت و ڕاستەوخۆ بچێت بۆ ئیمەیل.

جوانە، ئەڵبەت لە لای ڕاست سوچی خوارەوە بەستەرێکیشت بۆت دەردەکەوێت بۆ ناردنی پەیامی تایبەت وەکو ئەمەی مـن: Send ~~qezwan~~ an email کاتێک لەم بەستەرە کرتە دەکەیت پەنجەرەیەکی بچکۆلە دەکرێتەوە کە ئیمەیلەکەتانی تێدا نوسـراوە و سەردێرو پەیام دەنوسیت پاشان پەیامەکە ڕاستەوخۆ دەچێت بۆ ئیمەیلی ئەندام کە خۆی پێ تۆمار کردوە.




## ٨-چۆن بۆ وشەیێک بگەڕێم لە گوگڵ پلاس؟

نمونە: کاتێک بۆ پەڕەیەک یان وشەیەک بۆنمونە (کوردئایتیگرووپ) دەگەڕێم و لە خشتی گەڕان دەینوسم ودوگمەی گەڕان لیدەدەم پاشان لێرەدا هەربابەتێک کە پەیوەندی بەم وشەیەوە هەبێت بۆمان دەردەکەوێت بە شێوازی سلایدێر.



## ٩-چۆن ئاگاداری (notification) ناردراوەکانم ناچالاک بکەم؟

ئەگەر ناردراوەیەکتان لە وێنە ڤیدیۆنوسراوە لە گوگڵ پلاسەکەت بڵاوکردوە وبۆچوون وپەسەندکردنی زۆرە لەلایەن هاورێکانتانەوە، ئێوەش بێزاربوون لەوەڵام دانەوە یان هەرهۆکارێکی تر ئەوا بە سانایی دەتوانین بەکرتەکردنە سەر (notification) ئەو بابەتە دەتوانن ناچالاک یان **mute** بکەن لەپاشان دا چیتر ئاگاداریێکتان بۆ نایێت سەبارەت بەو بابەتەتان.



## ١٠-ئایا دەتوانم سەرخشتەکانی photos/videos/+1's لە پرۆفایلەکەم بشارمەوە؟




لە پەرەی پرۆفایل کرتەیێک لە سەر دوگمەی Edit profile (لە سەرەوە)بکەن پاشان کرتەیەک بکەنەسەر چوارگۆشەکەی تەنیشت ئەم رستەیە (Show this tab on your profile) و ناچالاکی بکەن ئەویش بەسرینەوەی نیشانەی ناو چوارگۆشەکەبۆ نمونە لەم وێنەی لای خوارەوە من سەرخشتەی +1's دەشارمەوە لە ئەندامان.




## ١١-چۆن بۆ پرۆفایلێک بە خێرایی بازنە دروستبکەم ؟

کاتێک سەردانی پرۆفایلێک دەکەیت ئەگەر پێشتر لە بازنەکەت نەبێت هێماکانت وەکو وێنەی خوارەوە دەردەکەوێت




کرتەیەک لە سەر دوکمەیAdd to circles بکەن پەنجەرەیەکی بچوکتان بۆ دەکرێتەوە کە ناوی بازنەکانتانی تێدایە بەڵام ئەگەر دەتانەوێت بۆ ئەم پرۆفایلە بازنەیێکی نوێ دروستبکەیت کرتەیەک لە سەر بەستەریCreate new circle بکەن و ناوی بازنەی تایبەت بنوسە(ئێمە بازنەی IT مان نوسی)، پاشان لە سەر دوگمەی Create کرتەیەک بکەن.




گەر بچیتە نێو بەرێوەبرایەتی بازنەکانت،بازنە نوێیە دروستکراوەکانتان دەبینین.



Sign in to Yahoo!
Are you protected? Create your sign-in seal.
Yahoo! ID
(e.g. free2rhyme@yahoo.com)
Password
Keep me signed in (Uncheck if on a shared computer)
Sign In
I can't access my account | Help

## ١٢- چـۆن هاوڕێکـانی فەیسـبووک بخەمـە نێـو بازنـەکانی گوگـڵ پـلاس ؟

بە ڕێزان پێشتر بە هەژمارەی گوگڵ(جی مەیل) دەتانتوانی بچنە نێـو فەیسـووک بـەڵام سیاسەتی فەیسـبووک گـۆڕاو ڕێینـەدا بەکارهێنـەران بـە هـەژمارەی جیمـەیل بێنە نێـو تۆڕەکەی!بـەڵام بـە هـەژمارەی یـاهوو وهاتمـەیل ئـەتوانن چوونـەژوورەوەتان بێت بـۆ فەیسبووک. چارە چیە ؟

١-سـەرەتا بچـنە نێـو هـەژمارەی هاتمـەیل یـان یاهوەکـەتان

٢-کرتەیێک لە سەر سەرخشتی contacts بکەن‌ئینجا لە سـەر دوگمـەی Import Contacts کرتـەیێک بکـەن بـۆ واردکردنی هەژمارەی هاوڕێیان (پەیوەندیەکان) لە خزمەتگوزاریە جیاوازەکانی تر وەکو Facebook، Gmail، Hotmail، AOL و...هتد کە ئێمە کرتە لە سەر فەیسبووک دەکەین.













پرسیارت لێدەکات بۆ هاوبەشکردن یان ناردنی هەژمارەکان لە فەیسبووک بۆ یاهوو(کرتە لە سەر دوگمەی Okay بکە)

پاش کرتە لە سەر دوگمەی Okay پەیامێکی پیرۆز بابیت لێدەکات کە ژمارەی ئەوەندە هەژمارە ناردرایە سەر هـەژمارەی یاهوەکەت ئینجا کرتە لە سەر دوگمەی Doneبکە.




٣- لەم قوناغە دەبێ هەژمارەکانت پاشکەوت بکەیت بس وەکو وێنەی خوارەوە کردار بکە:

تێبینی: کاتی کرتە لە سەر Export Now لە پەرگە لە نێو کۆمپیوتەرەکەت پاشکەوتی بکە.کە شێوازی پەرگەی دابەزاوە بەم شێوازەیە yahoo_ab.csv .

٤- ئێستا برۆ نێو هەژمارەی جی مەیلەکەت (www.gmail.com).

لە سوچی چەپی نێو ئیمەلەکەت لە سەر هێمای سێ گۆشەی لای وشەی Gmail کرتەیێک بکە:




ئینجا ئەچیتە پەرەیContacts وەک وێنەی خوارەوە کردار بکە( more>import ):




پەنجێرەیێکت بۆ دەکرێتەوە کە پەرگەی yahoo_ab.csv کە لە ژمارەی ٣ دادگرت ، لە نێو کۆمپیوترەکەت هەڵبژێرەو باری بکە.تا هەژمارەکان بار بنە نێو جیمەیلەکەت(وێنەی خوارەوە)




٥- ئێستا بچنە نێو گوگڵ پلاسەکەتان وکرتەیێک لە سەر هێمای بازنەکان بکەن(سوچی چەپ  )ئینجا لە سەر

دوگمـەیFind people کرتـەیێک بکە،پاشان دوگمـەی All suggestions (تـەواوی پێشـنیارەکان) دەردەکـەوێت وهەژمارەی یاهوەکەتی بۆ هەڵبژێرە.




تێبینی :ئەو کەسە کە لە ڕێگای هەژمارەی یاهوەکەتەوە بۆ نێو بازنەکـەت بانگهێشـت کرابێـت،ئـەوە هێمـای یـاهوی لای چوارگۆشەی وێنەکەی دەردەکەوێت.

چیمان کرد : بە کورتە خۆشەویستم لێرە هاورێکانت لە فەیسبووک خستە نێـو هـەژمارەی یاهوەکـەت ئینجا هـەژمارەی هاورێکانی یاهوەکەت خستە نێو هەژمارەی جی مەیلەکەت و لە نێو بازنەکانت داتنا .

## ١٣- چۆن وێنەکانی نێو هەژمارەی فەیسبووک بێنمە نێو گوگڵ پلاسەکەم ؟

یەکەم ئەم زیادکراوە دابگرە بۆ سەر وێبگەری کرۆمەکـەت Move You Photos ئینجا هێمـاییەکی زەرد لـە سـوچی ڕاستی وێبگەری کرۆم دەردەکەوێت:




کرتـەیێکی لـە سـەر بکـەو بچـۆ نێـو هـەژمارەی فەیسـبووکەکەت.پـەرەیێکت بـۆ دەکرێتەوە لە سەر وێبگەرەکەت کە تەواوی وێنـەکانی فیسـبووکەکەتی تێدایـە کـە بارت کردوە ،برۆ خوارەوەی ئەوپەرەو دوگمەی upload لێبدە تـا بـە تـەواوی وێنەکانت




باردەکرێن ئینجا برۆ نێو ئاڵبۆمی گالێری گوگڵ پلاسەکەت، گالێرییێکـت بـە نـاوەی Wall Photos بـۆ دروسـت بـوە .ئەمە وێنەکانی فەیسبووکە کەبارت کردبوو.دەتوانی بۆ دیتنی، سنوری بۆ دابنێت .هەر وا کە لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد.


له پەڕەی سەرەتایی گوگڵ پلاسیش وەکو ناردراوێک دەردەکەوێت :



کوتایی

هەر تۆڕێکی کۆمەڵایەتی بەهێز تەماشابکەین لەلایەن ڕەخنەگرانەوە شوێن و کون و کەلەبەری جیاوازی تێدا بەدی دەکرێت کە جێگەی ڕەخنەگرتن دەبێت ، گرنگترین خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە کار ئاسانی باشی تێدابێت بۆ بەکارهێنەرانی ( بەکارهێنەرانی ئاسایی) و بەشێوازێکی وا سانابێت کە بەکارهێنەرانی چێژی باشی لێوەرگرن . بەڵام سەبارەت بە بەکارهێنەرانی پێشکەوتوو خاوەن تواناو زانیاری ، گرنگترین خاڵ بریتیە لە کرداری پلاتفۆرمی تۆرە کۆمەڵایەتیەکە چۆنەو تا چ ڕادەیەک توانای هەیە و داهاتووی چۆن دەبێت.بەڵام بە بۆ چونی ئێمە توانای کار کردن لە گەڵ گوڵ+ بە واتەیێکی تر کار کردن بە تەواوی تواناکانی گوگڵە لە داهاتویەکی نزیک دایە .هەر وا گوگڵ پلاس تۆڕێکی کۆمەڵایەتی نیە بڵکو بەشێکی بنەڕەت لە ماڵپەڕی گوگڵە وچالاکیەکانی داهاتووی گوگڵ بۆ ئامێرە نوێکان سەرەتا بە ئیزنی ئەم بەشە(گوگڵ+) لە ئینتەرنێت دادەمەزرێت.

**خوێنەری بەڕێز :**

**هەرگرفتێک یان پێشنیارێکتان هەیە ئەتوانن لەرێگەی ئەم ئیمەیڵەی لای خوارەوە ئاگادارم بکەنەوە و بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە ڕەخنەو پێشنیارەکانتان بەهەند وەردەگرم.**

qezwan@gmail.com

